# كفن فرۆش !

-علي خيري

من ورڕەفیقەکەم لە بەردەم دوکانە داخراوەکەیدا چاوەڕێی بووین، هەناسە ساردەکانی زستان زۆر بە توندی پێیوە ئەداین،و دڵتەنگی ڕەفیقەکەم ڕۆحی خۆی ورڕۆحی منیشی لەو بەینەدا سووتاندبوو، کابرای ساحێب دوکانی کفن فرۆش هات، پیاوێکی پەنجا ساڵەی قژ رەساسی، پشت چەماوەیەکی مام ناوەند بوو، وێنەی دەموچاوی نازانم خۆیان وا نارەحەت دیار بوون یا حاڵەتی دەروونی ناسەنگی ئەو کاتی من ئەو هەستەی بۆ دروست کردبووم، هەر کە دەرگای دوکانەکەی کردەوە بۆنێکی سەیرمان بەسەردا هەڵات، دەستبەجێ نسبەتم دا بە مەرگ ومردنەوە، بۆنەکە بۆنێکی ناخۆش نەبوو، بەڵکو بە عەکسەوە بە لای عەتر وبۆنی خۆشەوە دەچوو بەڵام دڵی پیاوی تەنگ ئەکرد، ئەو ڕەشاییەی کابرای خاوەن دووکان لەسەر چوارچێوە دارییەکانیدا پەخشاندبووی ئەوەندەی تر هەستی دەڵتەنگیمی زیاتر دەکرد.

پێشتر خوێندبوومەوە کە خەڵکی ئەندەلوس لە کاتی سەرەخۆشیدا بەرگی سپی یان ئەپۆشی، جا نازانم ئەوانیش وەك چۆن ئێمە دڵمان بە ڕەنگی ڕەش تەنگ ئەبێ بە ڕەنگی سپی دڵیان تەنگ ئەبوو .. ئەوە مەبەستمە کە بیڵێم ئەوەیە کێشەکە لە ڕەنگەکەدایە یا لەو مانایەدایە کە ڕەنگەکە ئەیبەخشێ ؟

تاكه شتێك كه به خه‌یاڵی ڕه‌فیقه‌كه‌مدا ده‌سووڕایه‌وه ئه‌وه بوو باشترین كفن بۆ خوشكی كۆچ كردووی هه‌ڵبژێرێ، كه سه‌یری كابرای دوكاندارم كرد وه‌ك بازرگانێك ئه‌هاته به‌رچاوم كه چۆن له موشته‌رییه‌كانی ده‌ڕوانێ، له‌گه‌ڵ ئه‌وه‌ی خۆی وا له كاتی قسه‌كردندا نیشان ئه‌دا كه دڵته‌نگ وناڕه‌حه‌ته، وا دیاره ئه‌و دڵته‌نگییه دروستكراوه‌ش هه‌ر له پێویستییه‌كانی ئه‌م سه‌نعه‌ته‌یه، بیرم له‌وه كردووه ئه‌و كابرایه چۆن ئه‌م كاره‌ی بۆ خۆی ده‌ستنیشان كردووه، چۆن ژیانی خۆی له‌گه‌ڵ ئه‌و هه‌موو مردنه دا به‌سه‌ر ئه‌با ؟ ئه‌كرێ منداڵێك خه‌ون به‌وه ببینێ كه گه‌وره بێ دوكاندارێكی وه‌ك ئه‌و كابرایه‌ی لێ ده‌رچێ ؟ به نسبه‌ت ئێمه‌ی مرۆڤ پیشه‌یه‌كی زۆر گرنگه، به‌ڵام كێ حه‌ز ئه‌كا خاوه‌نی ئه‌م پیشه‌یه بێ ؟

بیرم له هه‌ستی ئه‌و پیاوه كرده‌وه له سه‌ره‌تا ڕۆژه‌كانی ئه‌و پیشه‌یه‌یدا؛ ئاخۆ له‌گه‌ڵ هه‌ر حاڵه‌تێكی به‌رده‌می وبه‌رده‌ستیدا ئێش وئازاری ئه‌كێشا ؟ ئه‌بێ دیدی ئه‌و پیاوه بۆ مردن چی بێ ؟ ئه‌بێ پێی ئاشنا بووبێت‌و وه‌ك به‌شێكی سه‌ره‌كی ژیانی خۆی قبووڵی پێ كردبێ ؟ به‌ڵكو وه‌ك سه‌رچاوه‌یه‌كی ڕزق وبژێوی ژیانی پێویستی پێیه‌تی ! یا ئه‌وه‌تا ئه‌ویش هه‌ر وه‌ك ئێمه لێی ئه‌ترسێ ؟

به‌ڵام هه‌ر ئه‌و دوكانداره‌یه كه ته‌نها ژیانی خۆی له‌گه‌ڵ مردنا به‌سه‌ر ئه‌با ؟ ئایه مردن نه‌بۆته ڕه‌فیقی ڕۆژانه‌مان له په‌خشی هه‌واڵه‌كاندا ؟! برایانمان له فه‌له‌ستین وسوریا ویه‌مه‌ن ولیبیا وعێراق وبۆرما به شێوه‌یه‌كی ڕۆژانه له‌به‌رچاومان دا گیان ئه‌ده‌ن، به‌ڵكو له هه‌ر ده‌قه‌و ساتێكدا كه‌چی نوقه‌مان لێ نایه‌ت، ته‌نانه‌ت بێ ئه‌وه‌ی هیچ له حاڵ وبارمان تێكدا؛ ژیانی خۆمان ئه‌به‌ینه سه‌ر، زۆرترین شتێكیش بیكه‌ین ئه‌وه‌یه كه ئایكۆنی "ناڕه‌حه‌تی كردم" له فه‌یسبووك داگرین، بۆ ئه‌وه‌ی ویژدانی مردووی خۆمانی پێ بحه‌سێنینه‌وه، یا له‌وانه‌یه وتار ونووسینی ئاگرین وبڵاوكراوه‌ی پڕ له فه‌ساحه‌ت وبه‌لاغه‌ت بڵاوكه‌ینه‌وه‌و، دواتر چاوه‌ڕێی لایك وكۆمێنتی ئه‌و وشانه‌مان بین، هه‌ر وه‌ك ئه‌و دوكانداره‌ی چاوه‌ڕێی وه‌رگرتنی نرخی كفنه‌كه‌یه‌تی.

ئەوەی لێی دەترسم ئەوەیە کە هەستەکانم بەرامبەر بەو مردنەی گەمارۆی ئوممەتەکەمانی داوەو، بەرامبەر بەو نەهامەتییانەی لە هەموو لایەکەوە دەوری داوین وەك دوکانداریکیان لێبێ، تاکە پیشەی من لەوەدا بێ کە دڵتەنگی لەخۆمدا نیشان دەم چونکە بەشێکە لەو پیشەیەم، یا ئەوەتا چونکە لەگەڵ نیشاندانی ئەو دڵتەنگییە لێڕاهاتووم، بێ ئەوەی هیچ هەوڵێك بۆ ڕزگارکردنی ئوممەتی نەخۆشمان بخەمە پێش.

هەوڵدە دکتۆرێك بیت زامەکانی ئوممەت تیمارکەیت وبەوە ڕازی مەبە لە شوێن ئەو کفن فرۆشە بیت کە چاوەڕێی مردنیەتی بۆ ئەوەی ڕۆڵی خۆی ئەنجامدا.



**پێگەی ئیسلامی گزنگ**

Facebook:- @Gizing.net

Telegram:- @GizingNet

١٤٣٨ - ٢٠١٦